# ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتوك: " دیاری لە پاداشتی ئیلاهی "
ئامادەکردنی: " هۆشیار نصرالدین کەلاری "
نەخشەسازی بەرگ: " عوسمان محمد"
نەخشەسازی ناوەوە: " عبدالله خاکی "
نۆرە و ساڵی چاپ: " یەکەم: ١٤٤٢ کۆچی – ٢٠٢١ میلادی "

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە «      »ی ساڵی «٢٠٢٠»ی پێ دراوە.

# پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين ، أما بعد:

ئەمەی بەردەستت کۆکردنەوەی ٧٥ فەرمایشتی خۆشەویستمانە ﷺ کە وەکو دیارییەکە لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ بەندەکانی سەبارەت بەو زیکر و کردەوانەی کە کاتێکی کەمی پێویستە و هەروەها ئاسانە ئەنجامدانی، بەڵام پاداشتێکی گەورەی بۆ ئامادەکراوە، ئەمەش وەکو فەزڵ و منەت و ڕەحمی خوای پەروەردگار بەرامبەر بەبەندەکانی هەربۆیە منیش ناوم لێنا (**دیاری لە پاداشتی ئیلاهی**).

شایانی باسە دەبێ سوپاس و دوعای خێر بۆ هەریەکە لەم بەڕێزانە لەبیر نەکەم کە ماندووبوون و ئەرکیان کێشا لەئامادەکردنی ئەم دیارییە، ئەوانیش:

## ❁❁ دیاری لە پاداشتی ئیلاهی ❁❁

- کاك عبدالله خاکی .

- کاك عثمان محمد .

خوای پەروەردگار پاداشتی خێریان بداتەوە و بیکاتە سەدەقە جارییە بۆیان . هەروەها هەموو ئەو خێرخوازانەی کە ئەرکی چاپکردنی ئەم بەرهەمەیان لەئەستۆ گرت کەبەڕاستی ئەگەر هەرکەسێ سودمەند بێ لەم بەرهەمە بەدڵنیاییەوە ئەو انیش پاداشت وەردەگرن ...

لەکۆتاییدا دەمەوێ ئەوە بڵێم کە هەموو فەرموودەکانی ناو ئەم کتێبە بەشێوەیەکی پێویست تەخریج کراون جگە لەو فەرموودانەی کە لەهەردوو سەحیحەکەن .

داواکارم لەخوای پەروەردگار لێمانی قبوڵ بفەرموێت و بیکاتە توێشوویەك بۆ قیامەتمان و هەروەها یارمەتی دەرمان بێت بۆئەوەی هەستین بەجێبەجێکردنی ئەم فەرموودانە.

وصلى الله وسلم على رسولنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

## ❁❁ دیاری لە پاداشتی ئیلاهی ❁❁

**هوشیار نصرالدين کەلاری**

**١٤٤٢/٧/٤**

**٢٠٢١/٣/١٧**

**کەلار**

## فەرموودەی یەکەم

**قال رَسُولُ الله ﷺ:**

**﴿مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ: اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ، وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وَ ابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ، حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾.[1]**

**پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:**

**هەرکەسێ گوێی لەبانگ بێت و ئەم دوعایە بڵێت: اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ، وَالصَّلاَةِ القَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّدًا الوَسِيلَةَ وَالفَضِيلَةَ، وَ ابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ، ئەوا ڕۆژی قیامەت ئەکەوێتە بەرشەفاعەتی من.**

---

[1] - رواه البخاري

## فەرموودەی دووەم

قال رَسُولُ اللهِ ﷺ:

﴿فَإِذَا كُنْتَ فِي غَنَمِكَ أَوْبَادِيَتِكَ فَأَذَّنْتَ بِالصَّلَاةِ، فَارْفَعْ صَوْتَكَ بِالنِّدَاءِ، فَإِنَّهُ لَا يَسْمَعُ مَدَى صَوْتِ الْمُؤَذِّنِ جِنٌّ وَلَا إِنْسٌ وَلَا شَيْءٌ، إِلَّا شَهِدَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

ئەگەرلەناو مەڕوماڵاتەکەت وگوندەکەت بووی، بانگت دا بۆ نوێژ، ئەوا دەنگت بەرزکەرەوە، چونکە: هەرشتێك چ جن بێت یا مرۆڤ یا هەرشتێک مەودای دەنگی بانگبێژ ببیستێ ئیلا لەقیامەت شایەتی بۆ ئەدات.

[1] - رواه البخاري

## فەرموودەی سێیەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ، فَيُبْلِغُ -أَوْ: فَيُسْبِغُ -الْوَضُوءَ، ثُمَّ يَقُولُ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ، إِلَّا فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةُ، يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەریەك لەئێوە دەستنوێژ بشوات بەجوانی و پاشان بڵێ: أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا عبدالله ورسوله، ئەوا هەرهەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ ئەکرێتەوە بەویستی خۆی لەهەرکامیانەوە ئەچێتە ژوورەوە.

[1]- رواه مسلم

## فەرموودەی چوارەم

**قال رَسُولُ الله ﷺ:**

**﴿مَنْ تَوَضَّأَ، فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ خَرَجَتْ خَطَايَاهُ مِنْ جَسَدِهِ حَتَّى تَخْرُجَ مِنْ تَحْتِ أَظْفَارِهِ﴾.[١]**

**پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:**

**هەر کەسێ دەستنوێژ بگرێ، بەڵام بەجوانی، ئەوا تاوانەکانی لە جەستەی دەردەچێ هەتاکو لەژێر نینۆکەکانیەوە.**

[١] - رواه مسلم

## فەرموودەی پێنجەم

قال رَسُولُ اللهِ ﷺ:

﴿مَنْ تَطَهَّرَفِي بَيْتِهِ ثُمَّ مَشَى إِلَى بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ لِيَقْضِيَ فَرِيضَةً مِنْ فَرَائِضِ اللَّهِ كَانَتْ خَطْوَتَاهُ إِحْدَاهُمَا تَحُطُّ خَطِيئَةً، وَالْأُخْرَى تَرْفَعُ دَرَجَةً﴾.[1]

---

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ دەستنوێژ لەماڵی خۆی بگرێ و پاشان بەپێ بڕوا بۆ ماڵێ لەماڵەکانی خوا (مزگەوت) بۆ جێبەجێکردنی فەرزێك لەفەرزەکانی خوا، ئەوا هەنگاوەکانی یەکێکیان تاوانەکانی دەسڕێتەوە و، ئەوی تر پلەیەک بەرزی دەکاتەوە.

[1] -رواه مسلم

## فەرموودەی شەشەم

قال رَسُولُ اللهِ ﷺ:

﴿مَا مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ، فَيُحْسِنُ الْوُضُوءَ، وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ يُقْبِلُ بِقَلْبِهِ وَوَجْهِهِ عَلَيْهِمَا إِلَّا وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هیچ کەسێك نیە دەستنوێژ بگرێ بەجوانترین شێوەو پاشان دوو ڕکات نوێژ بکات بەدڵ و جەستە ئاگای لێبێ، ئیلا بەهەشتی بۆ واجب ئەبێ.

[1] - رواه أبوداود(٩٠٦) وصححه الألباني رحمه الله وقواه كذالک الشيخ شعيب رحمه الله.

## فەرموودەی حەوتەم

قال رَسُولُ اللهِ ﷺ:

﴿مَنْ صَلَّى الْعِشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ، فَكَأَنَّمَا قَامَ نِصْفَ اللَّيْلِ، وَمَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّمَا صَلَّى اللَّيْلَ كُلَّهُ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ نوێژی عیشا لەمزگەوت بەجەماعەت ئەنجامبدات وەکو وایە نیوەی شەوشەونوێژی کردبێ، هەرکەسێ نوێژی بەیانیش بە جەماعەت ئەنجامبدات وەکو وایە هەموو شەوەکە شەونوێژی کردبێ.

[1] - رواه مسلم

## فەرموودەی هەشتەم

قال رَسُولُ اللّه ﷺ:

﴿صَلَاةُ الْجَمَاعَةِ تَفْضُلُ صَلَاةَ الْفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً﴾[١].

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

نوێژی بەکۆمەڵ ٢٧ پلە لەنوێژی تاك باشترە.

---

[١] - رواه البخاري و مسلم

## فەرموودەی نۆیەم

**قال رَسُولُ الله ﷺ:**

**﴿إِذَا أَمَّنَ الْإِمَامُ فَأَمِّنُوا، فَإِنَّهُ مَنْ وَ افَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَلَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ﴾.[1]**

**پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:**

**ئەگەرئیمام ئامینی کرد ئێوەش بڵێن آمین، چونکە هەرکەسێ ئامینەکەی هاوڕێکی ئامینی فریشتە بوو، ئەوا لەتاوانەکانی پێشووی خۆشەبن.**

[1] - رواه البخاري

## فەرموودەی دەیەم

**قال رَسُولُ اللهِ ﷺ:**

**﴿مَنْ صَلَّى لِلَّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا فِي جَمَاعَةٍ، يُدْرِكُ التَّكْبِيرَةَ الْأُولَى كُتِبَ لَهُ بَرَاءَتَانِ: بَرَاءَةٌ مِنَ النَّارِ، وَبَرَاءَةٌ مِنَ النِّفَاقِ﴾.**[1]

---

**پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:**

**هەرکەسێ ٤٠ ڕۆژ بۆ خوا نوێژ بکات و بگاتە تەکبیرەی یەکەم (نوێژدابەستن – ئیحرام) ئەوا دوو بەڕائەتی بۆ دەنوسرێ: بەڕائەتبون لەدۆزەخ و، بەڕائەتبون لە نیفاق.**

[1] رواه الترمذي (٢٣٨)، وحسنه الألبانی رحمه الله، بەڵام شوعەیب الأرناؤوط (رحمه الله) بەزەعیفی دادەنێت، لەبەر(حبیب ابن أبي حبیب البجلی) کەلەم سەنەدە کراوە بە (حبیب ابن أبي ثابت)، هەروەها لەدرێژەی تەخریجەکەی ئاماژە بەهۆی بەهەڵەداچوونی شێخ ئەلبانی دەکات کە بە سەحیحی داناوە لە (الصحیحه) و، هەوەها لە (صحیح الترغیب والترهیب) دا .

## فەرموودەی یازدەیەم

قال رَسُولُ الله ﷺ: ﴿يُصْبِحُ عَلَى كُلِّ سُلَامَى مِنْ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ، فَكُلُّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةٌ، وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ، وَنَهْيٌ عَنِ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ، وَيُجْزِئُ مِنْ ذَلِكَ رَكْعَتَانِ يَرْكَعُهُمَا مِنَ الضُّحَى﴾.[١]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ: کە ڕۆژدەبێتەوە لەسەرهەریەکەتان واجبە بۆهەرجومگەیەکی خێرێك بکات، جا هەرسبحان الله یەك خێرێکەو، هەرالحمدلله یەك خێرێکەو، هەرلا إله إلا الله یەك خێرێکەو، هەرفەرمان بەچاکەیەك خێرێکەو، هەرڕێگری لەخراپەیەك خێرێکە، بەڵام ئەنجامدانی دووڕکات نوێژی زوحا شوێنی هەموو ئەمانە ئەگرێتەوە.

❖ زانست دەریخستوە کە جەستەی مرۆڤ ٣٦٠ جومگەی تێدایە !

[١]- رواه مسلم

## فەرموودەی دوازدەیەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿عَلَيْكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ لِلَّهِ، فَإِنَّكَ لَا تَسْجُدُ لِلَّهِ سَجْدَةً إِلَّا رَفَعَكَ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً وَحَطَّ عَنْكَ بِهَا خَطِيئَةً﴾.[١]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

زۆرسوژدە بوە بۆخوا، چونکە تۆهەرسوژدەیەك ببەی بۆخوا ئیلا خوای گەورە بەهۆیەوە یەك پلە بەرزت ئەکاتەوە ویەك تاوانت لەسەرلا ئەبا.

[١] - رواه مسلم

## فەرموودەی سێزدەیەم

قال رَسُولُ اللَّه ﷺ:

﴿مَنْ صَلَّى فِي يَوْمٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ سَجْدَةً، تَطَوُّعًا بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەر کەسێ لەڕۆژێکدا ١٢ رکات نوێژی سوننەت بکات، ماڵێکی لەبەهەشت بۆ درووست ئەکرێ.

- زانایان ئەفەرموون مەبەست لەو١٢ رکات نوێژە سوننەتە، سوونەتەکانی پێشوو پاشی نوێژە فەرزەکانن، بەم شێوەیە:

_ دوو ڕکات پێش نوێژ بەیانی.

_ چوار ڕکات پێش نوێژی نیوەارۆ.

_ دوو ڕکات پاش نوێژی نیوەڕۆ.

_ دوو ڕکات پاش نوێژی مەغریب.

_ دوو ڕکات پاش نوێژی عیشا.

[1] - رواه مسلم

## فەرموودەی چوار دەیەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿ رَكْعَتَا الْفَجْرِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا ﴾.[١]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی باشترە لە هەموو دونیا و ئەوەشی تیایدایە.

[١] - رواه مسلم

## فەرموودەی پازدەیەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿مَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ، غُرِسَتْ لَهُ نَخْلَةٌ فِي الْجَنَّة﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ بڵێ: سبحان الله العظيم وبحمده، دارخورمایەکی لە بەهەشتدا بۆ ئەنێژرێ.

[1] - رواه الترمذی (٣٧٦٩)، وصححه الألباني رحمه الله، بەڵام شعيب الأرناؤوط (رحمه الله) ئەفەرموێ : حسن بشواهده، وهذا إسناد رجاله ثقات الا أن ابا الزبير مدلس، وقد عن عن .

## فەرموودەی شازدەیەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿مَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ. فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ، حُطَّتْ خَطَايَاهُ، وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ لەڕۆژێکدا ١٠٠ جاربڵێ سبحان الله وبحمده، تاوانەکانی ئەسڕێتەوە ئەگەربەئەندازەی کەفی دەریاش بێت.

[1] - رواه مسلم

## فەرموودەی حەڤدەیەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿من قرأ آية الكرسي دبر كل صلاة مكتوبة لم يمنعه من دخول الجنة إلا أن يموت﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ لەپاش هەموو نوێژە فەرزەکان ئایەتولکورسی بخوێنێ، تەنیا مردن ڕێگرە لەوەی بچێتە بەهەشتەوە.

[1] صححه الألبانى في صحيح جامع الصغير(٤٧٥٨)، والصحيحه (٩٧٢)

## فەرموودەی هەژدەیەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ، أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى كَنْزٍ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ ؟

فَقُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: قُلْ: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ﴾[١].

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

ئایا هەواڵت بدەمێ لەسەروشەیەك كە گەنجینەیەكە لەگەنجینەكانی بەهەشت بڵێ لا حول ولا قوة إلا بالله.

- ❖ مانای (لا حول ولا قوة الا بِاللَّهِ) بریتیە لەوەی كە هیچ گۆڕانكاریەك لە حاڵێكەوە بۆ حاڵێكیتر هەروەها هێزی ئەوگۆڕانكاریەش لەتوانای كەسدا نییە ، تەنها الله نەبێت

[١] - رواه البخاري و مسلم

## فەرموودەی نۆزدەیەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿ أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَكْسِبَ كُلَّ يَوْمٍ أَلْفَ حَسَنَةٍ ؟ فَسَأَلَهُ سَائِلٌ مِنْ جُلَسَائِهِ: كَيْفَ يَكْسِبُ أَحَدُنَا أَلْفَ حَسَنَةٍ ؟ قَالَ: يُسَبِّحُ مِائَةَ تَسْبِيحَةٍ، فَيُكْتَبُ لَهُ أَلْفُ حَسَنَةٍ، أَوْ يُحَطُّ عَنْهُ أَلْفُ خَطِيئَةٍ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

ئایا کەسێك لەئێوە بێدەسەڵاتە لەوەی هەموو ڕۆژێك هەزار چاکە بەدەست بێنێ؟ کەسێك لەدانیشتوانی کۆڕەکە پرسی: چۆن یەکێك لەئێمە هەزار چاکە بەدەست بێنێ؟ فەرمووی: سەدجار بڵێ سبحان الله، ئەوا هەزار چاکەی بۆ دەنوسرێ،یان هەزار تاوانی بچوکی لەسەر لا دەبرێ.

[1] - رواه مسلم

## فەرموودەی بیستەم

قال رَسُولُ اللهِ ﷺ:

﴿مَنْ جَلَسَ فِي مَجْلِسٍ، فَكَثُرَ فِيهِ لَغَطُهُ، فَقَالَ قَبْلَ أَنْ يَقُومَ مِنْ مَجْلِسِهِ ذَلِكَ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَ أَتُوبُ إِلَيْكَ، إِلَّا غُفِرَ لَهُ مَا كَانَ فِي مَجْلِسِهِ ذَلِكَ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ دانیشێ لە مەجلسێك و بێئاگایی زۆر تیاکرد، پێش ئەوەی هەستێ لەمەجلسەکە بڵێ: سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك و أتوب إليك ئەوا هەرچی لە تاوانی بچوك لەو مەجلسە کردبێ خوا لێی خۆش ئەبێ

[1] - رواه الترمذي (٣٧٣٢)، احمد (٨٨١٨)، ابن حبان(٥٩٤)، وصححه الألباني و شعيب الأرناؤوط .

## ❁❁ دیاری لە پاداشتی ئیلاهی ❁❁

# فەرموودەی بیست و یەکەم

**قال رَسُولُ الله ﷺ:**

﴿من قال: (السلامُ عليكم ( كُتِبَتْ له عشرُ حسناتٍ، ومن قال: (السلامُ عليكم ورحمةُ اللهِ ( كُتِبت له عشرون حسنةً، ومن قال: (السلامُ عليكم ورحمةُ الله وبركاتُه ( كُتِبَتْ له ثلاثونَ حسنةً. صحيح لغيره﴾[1]

**پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:**

**هەرکەسێ بڵێ: (السلام عليكم) ١٠ چاکەی بۆ ئەنوسرێ، هەرکەسێ بڵێ: (السلام عليكم ورحمة الله) ٢٠ چاکەی بۆ ئەنوسرێ، هەرکەسێ بڵێ: (السلام عليكم ورحمة الله وبركاته)**

**٣٠ چاکەی بۆ ئەنوسرێ.**

[1] - رواه الطبراني (٥٧٤) وقال الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: صحيح لغيره .

## فەرموودەی بیست و دووەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ: سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ، سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ﴾.[١]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

دوووشە هەن سوکن لەسەرزار، قورسن لەسەرمیزانی چاکەکان،

خۆشەویستن لای (الرحمن - الله):

سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظيم.

[١] - متفق عليه

## فەرموودەی بیست و سێیەم

قال رَسُولُ اللهِ ﷺ:

﴿لَقَدْ قُلْتُ بَعْدَكِ أَرْبَعَ كَلِمَاتٍ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، لَوْ وُزِنَتْ بِمَا قُلْتِ مُنْذُ الْيَوْمِ لَوَزَنَتْهُنَّ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ عَدَدَ خَلْقِهِ، وَرِضَا نَفْسِهِ، وَزِنَةَ عَرْشِهِ، وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ﴾.[١]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

لە پاش تۆ چوار وشەم سێجاروتەوە، ئەگەربكێشرێ بەهەموو ئەوەی ئەمرۆ تۆوتوتە ئەوا قورسترە: سبحان الله وبحمده، عدد خلقه ورضا نفسه وزنة عرشه ومداد كلماته.

- درێژەی فەرموودەکە: پێغەمبەر ﷺ بەیانیەکی زوو لەلای دایکە جوەیریە دەرچوو کاتێك نوێژی بەیانی کرد و، دایکە جوەیریە لە شوێنی نوێژەکەی خۆی بوو، پاشان پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە دوای ئەوەی کاتی زوحا

---

[١] - رواه مسلم

## ❁❁ دیاری لە پاداشتی ئیلاهی ❁❁

بەسەرچوبو، ئەوهەردانیشتبووزیکری دەکرد، پێی فەرموو: هێشتا هەر لەسەرئەوحاڵەتەی کە جێمهێشتی؟ وتی: بەڵێ.

## فەرموودەی بیست و چوارەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلَاةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْرًا﴾[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ یەکجارسەڵاواتم لەسەربدات خوای گەورە لەپاداشتیدا ١٠ جارسەڵاواتی لەسەردەدات.

[1] - رواه مسلم

## فەرموودەی بیست و پێنجەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿مَنْ سَبَّحَ اللَّهَ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، وَحَمِدَ اللَّهَ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، وَكَبَّرَ اللَّهَ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، فَتْلِكَ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ. وَقَالَ، تَمَامَ الْمِائَةِ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، غُفِرَتْ خَطَايَاهُ، وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ﴾.[١]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ لە پاش هەموو نوێژێك (فەرزەکان) ٣٣ سبحان الله و ٣٣ الحمدلله و ٣٣ الله أكبر بکات، ئەمەکردی ٩٩ لەتەواوی ١٠٠يش بڵێ: لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير، ئەوا لەتاوانەکانی خۆشەبن ئەگەرچی بەقەد کەفی دەریاش زۆربن.

[١] - رواه مسلم

## فەرموودەی بیست و شەشەم

قال رَسُولُ اللَّه ﷺ:

﴿سَيِّدُ الاِسْتِغْفَارِ أَنْ تَقُولَ: اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، خَلَقْتَنِي وَ أَنَا عَبْدُكَ، وَ أَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ وَ أَبُوءُ بِذَنْبِي، فَاغْفِرْلِي، فَإِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ. قَالَ: وَمَنْ قَالَهَا مِنَ النَّهَارِ مُوقِنًا بِهَا، فَمَاتَ مِنْ يَوْمِهِ قَبْلَ أَنْ يُمْسِيَ، فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَمَنْ قَالَهَا مِنَ اللَّيْلِ وَهُوَ مُوقِنٌ بِهَا، فَمَاتَ قَبْلَ أَنْ يُصْبِحَ، فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ.[١]

---

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

ئیستیغفارو داوای لێخۆشبوون ئەوەیە بڵێی: اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، خَلَقْتَنِي وَ أَنَا عَبْدُكَ، وَ أَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ وَ أَبُوءُ بِذَنْبِي، فَاغْفِرْلِي، فَإِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ هەرکەسێ بەڕۆژ بیخوێنێ و یەقینی پێی هەبێ ئەو ڕۆژە بمرێ

---

[١] - رواه البخاري

## دیاری لە پاداشتی ئیلاهی

ئەچێتە بەهەشتەوە، هەروەها هەرکەسێ بەشەو بیخوێنێ و یەقینی پێی هەبێ ئەوشەوە بمرێ ئەچێتە بەهەشتەوە.

## فەرموودەی بیست و حەوتەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿ مَنْ أَكَلَ طَعَامًا، فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنِي هَذَا وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلَا قُوَّةٍ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ نان بخوات و پاشان بڵێ: الحمدلله الذي أطعمني هذا، ورزقنيه من غير حول مني ولا قوة، لەتاوانە بچوکەکانی پێشوی خۆشەبن

[1] - رواه الترمذي (٣٧٦١) وحسنه، ورواه ابوداود (٤٠٢٣) و ابن ماجه (٣٢٨٥) وحسنه الألباني، وكذلك حسنه شعيب الأرناؤوط عند ابن ماجه .

## فەرموودەی بیست و هەشتەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿إِذَا أَخَذْتُمَا مَضَاجِعَكُمَا، تُكَبِّرَا أَرْبَعًا وَثَلَاثِينَ، وَتُسَبِّحَا ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ وَتَحْمَدَا ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمَا مِنْ خَادِمٍ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

ڕۆشتنە سەرجێگاکانتان ٣٤ جار الله أکبر بکەن،

٣٣ جار سبحان الله بکەن

٣٣ جار الحمدلله بکەن ئەوە لە خزمەتگوزار باشترە بۆتان.

[1] - رواه مسلم

## فەرموودەی بیست و نۆیەم

قال رَسُولُ الله ﷺ: ﴿مَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ -كَانَتْ لَهُ عَدْلَ عَشْرِ رِقَابٍ، وَكُتِبَتْ لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ، وَمُحِيَتْ عَنْهُ مِائَةُ سَيِّئَةٍ، وَكَانَتْ لَهُ حِرْزًا مِنَ الشَّيْطَانِ يَوْمَهُ ذَلِكَ حَتَّى يُمْسِيَ، وَلَمْ يَأْتِ أَحَدٌ أَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ إِلَّا أَحَدٌ عَمِلَ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ لەڕۆژێکدا ١٠٠ جاربڵێ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، ئەوا وەکو ئازادکردنی ١٠ کۆیلە وایە، هەروەها ١٠٠ چاکەی بۆ ئەنوسرێ و ١٠٠ تاوانی لەسەرئەسڕێتەوە و، ئەبێتە قەڵغانێك بۆی ئەوڕۆژە لە شەیتان ئەیپارێزێ تا ئێوارە، هەروەها کەسیش وەکو ئەو چاکەی نەکردوە مەگەرکەسێك لەوزیاتری کردبێ.

[1] - رواه مسلم

## فەرموودەی سێیەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿مَنْ تَعَارَّمِنَ اللَّيْلِ فَقَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، الْحَمْدُ لِلَّهِ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْلِي أَوْ دَعَا اسْتُجِيبَ لَهُ، فَإِنْ تَوَضَّأَ قُبِلَتْ صَلَاتُهُ﴾[1].

---

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ شەو لەخەو ڕاچڵەکێ و هەستێ لەخەو و پاشان بڵێ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، الْحَمْدُ لِلَّهِ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ پاشان بڵێ: خوایە لێمخۆشبە یا دوعا بکات وەڵام ئەدرێتەوە، ئەگەر دەستنوێژ بگرێ و نوێژ بکات وەرەگیرێ.

---

[1] - رواه البخاري

## فەرموودەی سی و یەکەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بَعَّدَ اللَّهُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ یەك ڕۆژلەپێناوخوا ڕۆژووبگرێ، خوای گەورە ٧٠ ساڵ ڕووی لەدۆزەخ دوورئەخاتەوە.

[1] - رواه البخاري و مسلم

## فەرموودەی سی و دووەم

**قال رَسُولُ اللهِ ﷺ:**

﴿وَإِنَّ بِحَسْبِكَ أَنْ تَصُومَ كُلَّ شَهْرٍ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، فَإِنَّ لَكَ بِكُلِّ حَسَنَةٍ عَشْرَ أَمْثَالِهَا فَإِنَّ ذَلِكَ صِيَامُ الدَّهْرِ كُلِّهِ﴾.[١]

**پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:**

ئەوەندەت بەسە لەهەرمانگێکدا سێ ڕۆژڕۆژوو بگری، چونکە بۆ هەر چاکەیەك دە هێندەی پاداشتت هەیە، بەمەش دەبێتە ڕۆژووی هەموو ساڵەکە

[١] - رواه البخاري و مسلم

## فەرموودەی سی و سێیەم

قال رَسُولُ اللهِ ﷺ:

﴿مَنْ صَامَ رَمَضَانَ، ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتًّا مِنْ شَوَّالٍ، كَانَ كَصِيَامِ الدَّهْرِ﴾ .[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ مانگی ڕەمەزان ڕۆژو بگرێ و پاشان شەش ڕۆژلە مانگی شەوال بگرێ وەکو وایە هەموو ساڵەکە بەڕۆژوو بوبێ.

[1] - رواه مسلم

## فەرموودەی سی و چوارەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿يَوْمِ عَاشُورَاءَ أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ﴾.[١]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

ڕۆژووی ڕۆژی عاشورا تکام و ایە لای خوا کەوا ببێتە کەفارەتی سڕینەوەی تاوانەکانی ساڵەکەی پێش خۆی.

[١] - رواه مسلم

## فەرموودەی سی و پێنجەم

قال رَسُولُ اللهِ ﷺ:

﴿صِيَامُ يَوْمِ عَرَفَةَ أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ، وَالسَّنَةَ الَّتِي بَعْدَهُ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

ڕۆژووی عەرەفە تکام و ایە لای خوا کەوا ببێتە کەفارەتی سڕینەوەی تاوانەکانی ساڵەکەی پێش خۆی و ساڵەکەی پاش خۆی.

[1] - رواه مسلم

## فەرموودەی سی و شەشەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿مَنْ غَسَّلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاغْتَسَلَ، ثُمَّ بَكَّرَ وَابْتَكَرَ، وَمَشَى وَلَمْ يَرْكَبْ، وَدَنَا مِنَ الْإِمَامِ فَاسْتَمَعَ وَلَمْ يَلْغُ، كَانَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ عَمَلُ سَنَةٍ، أَجْرُ صِيَامِهَا وَقِيَامِهَا﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ ڕۆژی جومعە سەری بشوات وجەستەشی بشوات و،پاشان لەکاتی زوودا وبەپیادە وبەبێ سواری بڕوا بۆ مزگەوت و، نزیکی ئیمام دانیشێت وگوێ بگرێ وخۆی سەرقاڵ نەکات، ئەوا بەهەر هەنگاوێکی پاداشتی کردەوەی ساڵێکی هەیە ڕۆژەکەی بەڕۆژوو بێت وشەوەکەشی شەونوێژی کردبێ

[1] - رواه أبوداود (٣٤٥) والترمذي (٥٠٢) والنسائي )١٦٩٧) وابن ماجه (١٠٨٧) وأحمد (١٦١٧٣) وابن حبان في صحيحه (٢٧٨). وصححه شعيب الأرناؤوط (رحمه الله)

## فەرموودەی سی و حەوتەم

قال رَسُولُ اللهِ ﷺ:

﴿مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُبْسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، أَوْ يُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ ئەیەوێ ڕزقی فراوان بێ و، بەباشە باسبکرێ لەپاش مردنی، ئەوا با پەیوەندی خزمایەتی جێبەجێ بکات.

---

[1] - رواه البخاري و مسلم

# فەرموودەی سی و هەشتەم

**قال رَسُولُ الله ﷺ:**

**﴿إِنَّ الْمُؤْمِنَ لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ خُلُقِهِ دَرَجَةَ الصَّائِمِ الْقَائِمِ﴾.**[١]

**پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:**

**بەڕاستی باوەڕدار بە ڕەوشتی بەرزی دەگاتە پلەی ڕۆژووگری بەردەوام و شەونوێژ خوێنی بەردەوام.**

[١] رواه ابوداود (٤٧٩٨) وصححه الألباني رحمه الله، ولكن قال الشيخ شعيب الأرناؤوط رحمه الله : حديث صحيح لغيره، وهذا إسناد ضعيف لأنقطاعه ...

ورواه احمد في مسنده (٢٥٠١٣) والبغوي في شرح السنة (٣٥٠١) والطحاوي في شرح مشكل الآثار (٤٤٢٧) و ابن حبان في صحيحه(٤٨٠) والحاكم في المستدرك (٦٠\١) أنظرلزاما سنن أبي داود بتحقيق شعيب الأرناؤوط وفريقه .

## فەرموودەی سی و نۆیەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾.[١]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ عەیبەی موسوڵمانێك داپۆشێ، خوای گەورە عەیبەی دا دەپۆشێ لەقیامەتدا.

[١] رواه مسلم

## فەرموودەی چل

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿أَنَا زَعِيمٌ بِبَيْتٍ فِي رَبَضِ الْجَنَّةِ لِمَنْ تَرَكَ الْمِرَاءَ وَإِنْ كَانَ مُحِقًّا، وَبِبَيْتٍ فِي وَسَطِ الْجَنَّةِ لِمَنْ تَرَكَ الْكَذِبَ وَإِنْ كَانَ مَازِحًا، وَبِبَيْتٍ فِي أَعْلَى الْجَنَّةِ لِمَنْ حَسُنَ خُلُقُهُ﴾.[1]

---

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

من گرەنتیماڵێك لە کەناری بەهەشت دەکەم بۆئەوکەسەی کەوازدەهێنێ لە دەمەقاڵێ ئەگەریش لەسەر حەق بێت، هەروەها بەماڵێك لەناوەڕاستی بەهەشت بۆئەوکەسەی کەوازدەهێنێ لەدرۆ ئەگەر بەگاڵتەشەوە بێ، هەروەها بەماڵێك لەسەروی بەهەشت بۆئەوکەسەی کە ڕەوشتی جوانە.

---

[1] - رواه أبوداود(٤٨٠٠) وحسنه الألبانی و الشیخ شعیب الأرناؤط (رحمه الله الجمیع)

# فەرموودەی چل و یەکەم

قال رَسُولُ اللّٰه ﷺ:

﴿وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ، يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ کارئاسانی بکات بۆکەسێکی تر، خوای گەورە کاری لە دونیا و قیامەت ئاسان دەکات.

- لەم زەمەنەی کە هەموو شت بوەتە بەژەوەندی و سستمی سەرمایە داری باڵی بەسەر جیهاندا کێشاوە کارێکی زۆر پێوەیست و گەورەیە، بەتایبەتی دەبێت موسڵمانان وەک و خوشک و برای یەکتر و بەبێ هەستکردن بە قورسی و ناڕەحەتی یارمەتی یەکتربدەن.

---

[1] - رواه مسلم

## فەرموودەی چل و دووەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿مَنْ كَظَمَ غَيْظًا وَهُوَ قَادِرٌ عَلَى أَنْ يُنْفِذَهُ، دَعَاهُ اللَّهُ عَزَّوَجَلَّ عَلَى رُءُوسِ الْخَلَائِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُخَيِّرَهُ اللَّهُ مِنَ الْحُورِ الْعِينِ مَا يَشَاءُ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ تووڕەییەك بخواتەوە لەکاتێکدا توانای هەبێ جێبەجێی بکات، ئەوا خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا لەپێش چاوی هەموو خەڵکیەوە بانگی دەکات تا بەویستی خۆی حۆری هەڵبژێری.

[1] - رواه ابوداود (٤٧٧٧) والترمذي (٢١٤٠) وابن ماجه(٤١٨٦) وهوفي مسند احمد (١٥٦١٩) وحسنه الألباني وشعيب الأرناؤوط رحمه الله.

## فەرموودەی چل و سێیەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿مَنْ يَضْمَنْ لِي مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ، وَمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ أَضْمَنْ لَهُ الْجَنَّةَ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ گرەنتی پاراستنی زمان و داوێنی بکات، منیش گرەنتی بەهەشتی بۆ ئەکەم.

- بەڕاستی لەم زەمەنی فیتنەیەدا ولەم زەمەنەی کە ئاسانکاری دەکرێ بۆ بڵاوکردنەوەی هەواڵی درۆ و بوختان لەگەڵ ئاسانکاری بۆخراپەکاری و داوێنپیسی پاراستنی زمان و داوێن ئەرکێکی قورس وزەحمەت بووە بەتایبەتی لەسەرگەنجەکانمان، بۆیە پەنا دەگرین بە الله و داوای پاراستن و سەلامەتی هەرلە ئەو دەکەین.

[1] - رواه البخاري

## فەرموودەی چل و چوارەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ فَيَتَصَافَحَانِ، إِلَّا غُفِرَلَهُمَا قَبْلَ أَنْ يَفْتَرِقَا﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هیچ دوو موسڵمانێك نیە کاتێ ئەگەن بەیەك و تەوقە ئەکەن ئیلا خوا لێیان خۆشدەبێ پێش ئەوەی لەیەکتر جیا ببنەوە.

[1] - رواه الترمذي (٢٩٢٨) و ابو داود (٥٢١١) و ابن ماجه (٣٧٠٣) وهو في المسند(١٨٥٤٧) وصححه الألباني رحمه الله، ولكن قال شعيب الأرناؤوط في تحقيق سنن الترمذي: صحيح لغيره

## فەرموودەی چل و پێنجەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا، نَفَّسَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ نارەحەتیەك لەنارەحەتیەکانی دونیا لەسەر ئیماندارێك هەڵگرێ (لابدات)، خوا نارەحەتیەك لەنارەحەتیەکانی قیامەتی لەسەر هەڵدەگرێت (لادەبات).

---

[1] رواه مسلم

## فەرموودەی چل و شەشەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿مَنْ عَادَ مَرِيضًا لَمْ يَزَلْ فِي خُرْفَةِ الْجَنَّةِ. قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا خُرْفَةُ الْجَنَّةِ ؟ قَالَ: جَنَاهَا﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ سەردانی نەخۆشێك بكات، ئەوا تادەگەڕێتەوە لە خورفەی بەهەشتە، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا خورفەی بەهەشت چیە؟ فەرمووی: چنینەوەی میوەکانێتی.

[1] - رواه مسلم

## فەرموودەی چل و حەوتەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ أَحَبَّ الْعَمَلِ إِلَى اللَّهِ أَدْوَمُهُ وَإِنْ قَلَّ﴾.[١]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

خۆشەویستترینی کردارەکان لای خوا ئەوەیە کەبەردەوامی هەیە ئەگەرچی کەمبێت.

[١] - متفق عليه

## ❁❁ دیاری لە پاداشتی ئیلاهی ❁❁

# فەرموودەی چل و هەشتەم

**قال رَسُولُ اللہ ﷺ:**

**﴿مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُقْرِضُ مُسْلِمًا قَرْضًا مَرَّتَيْنِ إِلَّا كَانَ كَصَدَقَتِهَا مَرَّةً﴾.[1]**

**پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:**

**هیچ موسوڵمانێك نیە دووجار قەرزبدات بە موسوڵمانێکی تر، ئیلا وەك ئەوەیە جارێك بەسەدەقە پێی بەخشیبێ.**

[1] - رواه ابن ماجه (٢٤٣٠) وأحمد (٣٩١١) أبن حبان ( ٥٠٤٠) والطبراني في الكبير(١٠٢٥٠) والبيهقي في السنن وصححه الألباني رحمه الله، ولكن حسنه شعيب الارناؤط (رحمه الله الجميع).

## فەرموودەی چل و نۆیەم

قال رَسُولُ اللهِ ﷺ:

﴿وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

خوای پەروەردگار لە یارمەتیدانی بەندەکەیەتی تائەوکاتەی بەندەکە لەیارمەتیدانی براکەیەتی.

[1] - رواه مسلم

## فەرموودەی پەنجایەم

قال رَسُولُ اللهِ ﷺ:

﴿وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ لِلَّهِ إِلَّا رَفَعَهُ اللَّهُ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ لەبەر خوا خاکیبون و تەوازوع بنوێنێ، ئیلا خوا بەرزی ئەکاتەوە.

[1] - رواه مسلم

## فەرموودەی پەنجا و یەکەم

قال رَسُولُ اللّٰه ﷺ:

﴿مَنْ دَلَّ عَلَى خَيْرٍ فَلَهُ مِثْلُ أَجْرِ فَاعِلِهِ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ چاکەیەك پیشانی کەسێك بدات ئەوا پاداشتی بکەری چاکەکەی هەیە.

- بەڕاستی زۆر پێویستە لەم سەردەمە گەر چاکەیەک بزانیین و شارەزابین کەسانی تریشی بۆ بانگ بکەین هەم بۆ پاداشتی قیامەت و هەمیش بۆ چاکسازی کۆمەڵگامان کە ئێستا وا بەرەو داڕوخان دەچێ...

[1] - رواه مسلم

## فەرموودەی پەنجا و دووەم

قال رَسُولُ اللهِ ﷺ:

﴿لَقَدْ رَأَيْتُ رَجُلًا يَتَقَلَّبُ فِي الْجَنَّةِ، فِي شَجَرَةٍ قَطَعَهَا مِنْ ظَهْرِ الطَّرِيقِ، كَانَتْ تُؤْذِي النَّاسَ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

پیاوێکم بینی لە بەهەشتدا ئەسوڕایەوە لەپاداشتی بڕینەوەی دارێك لەسەر ڕێگا کە ئازاری خەڵکی ئەدا.

[1] - رواه مسلم

## فەرموودەی پەنجا و سێیەم

**قال رَسُولُ الله ﷺ:**

**﴿الرَّاحِمُونَ يَرْحَمُهُمُ الرَّحْمَنُ، ارْحَمُوا مَنْ فِي الْأَرْضِ يَرْحَمْكُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ﴾.[1]**

**پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:**

**بەزەیی و ڕەحمەکان الله -کە یەکێك لەناو و سیفاتەکانی الرحمن-ە ڕەحمیان پێ ئەکات، ئێوە سۆز و ڕەحمتان بەرامبەر خەڵکی سەر زەوی هەبێ، ئەوەی لە ئاسمانە کە الله یە ڕەحمتان پێ ئەکات.**

[1] - رواه الترمذي (٢٠٣٧) وصححه الألباني رحمه الله، وأخرجه أبوداود (٤٩٤١) وهو في المسند (٦٤٩٤) وقال الشيخ شعيب صحيح لغيره..

## فەرموودەی پەنجا و چوارەم

قال رَسُولُ اللّٰه ﷺ:

﴿إِنَّ اللَّهَ قَالَ: إِذَا ابْتَلَيْتُ عَبْدِي بِحَبِيبَتَيْهِ فَصَبَرَ، عَوَّضْتُهُ مِنْهُمَا الْجَنَّةَ. يُرِيدُ عَيْنَيْهِ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ئەگەر بەندەکەم تاقیکردەوە بە لەدەستدانی دوو خۆشەویستەکەی و ئارامی لەسەرگرت، لەقەرەبووی ئەوە (لەبری ئەوەدا) بەهەشتی ئەدەمێ، مەبەستی هەردوو چاوەکانێتی.

[1] - رواه البخاري

## فەرموودەی پەنجا و پێنجەم

قال رَسُولُ اللهِ ﷺ:

﴿وَمَنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً، فَإِنْ هُوَ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ سَيِّئَةً وَاحِدَةً﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ ختورە بەخراپەیەك بکات و ئەنجامی نەدات، ئەوا خوا لای خۆی بە چاکەیەکی تەواو بۆی تۆمار دەکات، خۆ ئەگەر ختورەی کرد و ئەنجامی دا ئەوا خوا بەیەك خراپە تۆماری دەکات.

[1] - متفق مسلم

## ❁❁ دیاری لە پاداشتی ئیلاهی ❁❁

# فەرموودەی پەنجا و شەشەم

قال رَسُولُ اللهِ ﷺ:

﴿يَا أَبَا سَعِيدٍ، مَنْ رَضِيَ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ ڕازی بێ بەوەی الله پەروەردگاری بێ و، ئیسلام دین و بەرنامەی بێ و محمد پێشەواو پەیامبەری بێ، بەهەشتی بۆ واجب ئەبێت

❖ هەڵبەتە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ تەنیا ڕازی بوونی زارەکی و گوفتار نیە بەڵکوو ڕازیبون و ملکەچبون بەکردارو گوفتاریش..

---

[1] - رواه مسلم

## فەرموودەی پەنجا و حەوتەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿ أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ قَالَ أَنَسٌ: فَأَنَا أُحِبُّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَ أَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ مَعَهُمْ بِحُبِّي إِيَّاهُمْ، وَإِنْ لَمْ أَعْمَلْ بِمِثْلِ أَعْمَالِهِمْ ﴾.[١]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

(تۆ لەگەڵ ئەوکەسەی کە خۆشت ئەوێ) ، ئەنەس ڕەزای خوای لێبێ ئەفەرموێ: من پێغەمبەرم خۆشەوێ ﷺ و ئەبوبەکر و عومەر، تکام وایە بەهۆی خۆشەویستیمەوە بۆیان لەگەڵیان بم، ئەگەرچی کردەوەم هاوشێوەی کردەوەی ئەوان نەکردبێ.

- خوایە شاهێدبە منیش پێغەمبەرﷺ و ئەبوبەکر و عومەر و ئەنەس و باقی هاوەڵانم خۆشەوێ.

---

[١] - متفق علیه

## فەرموودەی پەنجا و هەشتەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿مَنْ بَنَى مَسْجِدًا لِلَّهِ بَنَى اللَّهُ لَهُ فِي الْجَنَّةِ مِثْلَهُ﴾.[١]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ مزگەوتێك لەبەرڕەزامەندی خوا درووست بکات، خوای گەورە لە بەهەشت هاوشێوەی ئەوە بۆی درووست ئەکات.

[١] - متفق عليه

## فەرموودەی پەنجا و نۆیەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿مَنْ سَأَلَ اللَّهَ الشَّهَادَةَ بِصِدْقٍ بَلَّغَهُ اللَّهُ مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ، وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ بەڕاستی داوای شەهیدی بکات، خوای گەورە ئەیگەیەنێتە پلەی شەهیدان ئەگەرلەسەرجێگاکەشی بمرێ.

[1] - رواه مسلم

## فەرموودەی شەستەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿دَعْوَةُ الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ لِأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ مُسْتَجَابَةٌ، عِنْدَ رَأْسِهِ مَلَكٌ مُوَكَّلٌ، كُلَّمَا دَعَا لِأَخِيهِ بِخَيْرٍ قَالَ الْمَلَكُ الْمُوَكَّلُ بِهِ: آمِينَ، وَلَكَ بِمِثْلٍ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

دوعای موسوڵمان بۆ براکەی لەپاشملە وەرگیراوە، لەلای سەریەوە فریشتەیەك دانراوە، هەرکات دوعای خێری کرد بۆ براکەی، فریشتەکە ئەڵێ: آمین .هاوشێوەی ئەوەش بۆ تۆ.

[1] - رواه مسلم

## فەرموودەی شەست و یەکەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿الْمَلَائِكَةُ تُصَلِّي عَلَى أَحَدِكُمْ مَا دَامَ فِي مُصَلَّاهُ مَا لَمْ يُحْدِثْ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ. لَا يَزَالُ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاةٍ مَا دَامَتِ الصَّلَاةُ تَحْبِسُهُ، لَا يَمْنَعُهُ أَنْ يَنْقَلِبَ إِلَى أَهْلِهِ إِلَّا الصَّلَاةُ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

فریشتە دوعا بۆ هەریەکێ لەئێوە ئەکات تاکو لە مزگەوتدا بمێنێتەوە:

خوایە لێی خۆشبە، خوایە ڕەحمی پێبکە.

هەریەکێ لەئێوە لەنوێژدایە تاکو بەهۆی نوێژەوە لەمزگەوت چاوەڕێبێ، هیچ شتێ ڕێگرنیە بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە تەنها نوێژەکەی نەبێت.

---

[1] رواه البخاري و مسلم

## فەرموودەی شەست و دووەم

قال رَسُولُ اللهِ ﷺ:

﴿مَنِ اتَّبَعَ جَنَازَةَ مُسْلِمٍ -إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا -وَكَانَ مَعَهُ حَتَّى يُصَلَّى عَلَيْهَا، وَيَفْرُغَ مِنْ دَفْنِهَا فَإِنَّهُ يَرْجِعُ مِنَ الْأَجْرِ بِقِيرَاطَيْنِ، كُلُّ قِيرَاطٍ مِثْلُ أُحُدٍ، وَمَنْ صَلَّى عَلَيْهَا ثُمَّ رَجَعَ قَبْلَ أَنْ تُدْفَنَ فَإِنَّهُ يَرْجِعُ بِقِيرَاطٍ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ شوێنی تەرمی موسوڵمانێ بکەوێ، باوەڕی بەپاداشتەکەی هەبێ و چاوەڕێی پداشتەکەی بکات، هەروەها لەگەڵیدابێت تاکو نوێژی لەسەر دەکرێ و لێدەبنەوە لەناشتنی، ئەوا بەدووقیراط لەپاداشت دەگەڕێتەوە، هەرقیراتێکیان بەئەندازەی کێوی ئوحودە، و هەرکەسێ نوێژی لەسەربکاو پاشان بگەڕێتەوە پێش ئەوەی بنێژرێ، ئەوا بەقیراتێ پاداشت دەگەڕێتەوە.

[1] رواه البخاري

## فەرموودەی شەست و سێیەم

قال رَسُولُ اللَّه ﷺ:

﴿مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ الْكَهْفِ عُصِمَ مِنَ الدَّجَّالِ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ ١٠ ئایەتی سەرەتای سورەتی کەهف لەبەربکات، پارێزراو دەبێ لە دەججال.

[1] - رواه مسلم

# فەرموودەی شەست و چوارەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿وَمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ، وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ، إِلَّا نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَحَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ﴾.[١]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هیچ دەستەیەك كۆنابنەوە لەماڵێك لەماڵەكانی الله، قورئانەكەی بخوێنن و لەنێوان خۆیاندا دەوری بكەنەوە، ئەوا ئارامی دادەبارێتە سەریان و ڕەحمەت دایان دەپۆشێ و فریشتە دەوریان دەدەن و، الله تعالى لای فریشتەنزیكەكانی باسیان دەكات.

❖ بەڕاستی لەم سەردەمە كە قورئان هەجر كراوە زۆر پێویستە بۆ موسوڵمانان بەتایبەتی لە ئاستی خێزاندا خۆیان سەرقاڵ بكەن بە خوێندنەوە و تیگەیشتن لە قورئانی پیرۆزلە برِی سەرقاڵی بە شتی

[١]- رواه مسلم

## ❁❁ دیاری لە پاداشتی ئیلاهی ❁❁

بێبایەخەوە وەکو کەناڵەکان و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان کە نەک سوودی نییە بەڵکو بەهۆی کەمتەرخەمی و کات بەفیڕۆ دانەیشەوە تاوانباردەبین.

## فەرموودەی شەست و پێنجەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿مَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا، سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ﴾.[١]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هەرکەسێ ڕێگەیە بگرێتە بەربۆ بەدەستهێنانی زانستی شەرعی، ئەوا الله تعالی ڕێگەیەکی بۆ بەهەشت بۆ ئاسان ئەکات.

- هەوڵدان بۆ دەستخستنی زانستی شەرعی لەم سەردەمەدا ئەرکێکی زۆر گرنگ وکارێکی زۆرگەورەیە بەتایبەتی لە کاتی بڵاوئەم هەموو جەهل و نەفامی وگومانانەی لەسەربابەتە جێگیرەکان.

[١]- رواه مسلم

## فەرموودەی شەست و شەشەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿مَا مِنَ النَّاسِ مُسْلِمٌ يَمُوتُ لَهُ ثَلَاثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ، لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ إِلَّا أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمْ﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

لەناوخەڵکیدانیە موسڵمانێك سێ منداڵی بمرن (پێش ئەوەی بگەنە تەمەنی بلوغ)

ئیلا خوا بەفەزڵی ڕەحمەتی بۆ ئەو سێ منداڵە ئەیخاتە بەهەشتەوە

❖ بەسێ منداڵەکە ئەوترێ: بڕۆنە بەهەشتەوە، ئەڵێن:

نەخێر تا دایك و باوکیشمان نەیەن نارۆین.

[1] - رواه البخاري.

## فەرموودەی شەست و حەوتەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿ليس أحد من أمتي يعول ثلاث بنات أو ثلاث أخوات فيحسن إليهن إلا كن له سترا من النار﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

هیچ کەسێك نیە لە ئوممەتەکەم سەرپەرشتی بەخێوکردنی سێ کچ یا سێ خوشك بگرێتە ئەستۆ، چاکە بکات لەگەڵیاندا، ئیلا ئەبنە ڕێگر بۆی لەئاگری دۆزەخ.

[1] - رواه البيهقي في شعب الإيمان عن عائشة رضي الله عنها، وصححه الألباني في صحيح الجامع(٦٥٥٢) والصحيحة (٣١٤٣) .

## فەرموودەی شەست و هەشتەم

قال رَسُولُ اللهِ ﷺ:

﴿كَافِلُ الْيَتِيمِ لَهُ أَوْ لِغَيْرِهِ، أَنَا وَهُوَ كَهَاتَيْنِ فِي الْجَنَّةِ. وَأَشَارَ مَالِكٌ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى﴾.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

سەرپەرشتیاری یەتیم چ یەتیمی خۆی بێ یان هی کەسێکی تر من و ئەو وەکو ئەم دوانەین لە بەهەشت، (مالك (ڕاویەکە) ئاماژەی بە پەنجەی شایەتومان و ناوەڕاستدا)

[1]- رواه مسلم

## فەرموودەی شەست و نۆیەم

**قال رَسُولُ الله ﷺ:**

**﴿سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ: الْإِمَامُ الْعَادِلُ﴾[1]**

**پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:**

**حەوت کۆمەڵە هەن خوا لەڕۆژی قیامەتدا ئەیانخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە، لەو ڕۆژەی کەهیچ سێبەرێك نیە جگە لەو سێبەرە،... لەناویاندا: پێشەوایەکی دادپەروەر.**

- **بۆیە ئێستا ئەم هەموو کێشە و گەندەڵی و ئاژاوەیە لە جیهاندا بوونی هەیە هۆکارەکەی بە پلەی یەکەم وەلاخستنی حوکمی قورئانە پاشان نەبوونی پێشەوای دادپەروەر.**

[1] - متفق علیه

## فەرموودەی حەفتا

قال رَسُولُ اللهِ ﷺ:

﴿سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ:

شَابٌّ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ رَبِّهِ﴾[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

حەوت کۆمەڵە هەن خوا لەڕۆژی قیامەتدا ئەیانخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە... گەنجێك تەمەنی گەنجێتی لەخواپەرستیدا بباتە سەر

❖ ئەی کە بەڕاستی لەم زەمەنەدا ئەرکێکی یەگجار قورس و زەحمەتە بەسەربردنی تەمەنی گەنجێتی لە عیبادەت و خواپەرستیدا جا ئەمە گرنگیی ڕۆڵی پەروەردەی دایک و باوک و بانگخوازان و خەمخۆران دەردەخات تا چ ڕادەیەک هەستاون بە ئەرکی خۆیان سەبارەت بە پەروەردە و پێگەیاندن.

[1] - متفق عليه

## فەرموودەی حەفتا و یەکەم

**قال رَسُولُ اللّٰه ﷺ:**

**﴿سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ:**

**رَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي الْمَسَاجِدِ﴾[1]**

---

**پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:**

**حەوت کۆمەڵە هەن خوا لەڕۆژی قیامەتدا ئەیانخاتە ژێرسێبەری عەرشی خۆیەوە...**

**پیاوێك دڵی لەمزگەوت هەڵواسرابێ**

- **یانی بەردەوام بیری لای نوێژەکانی بێ لەکاتی خۆی ولەمزگەوت ئەنجامی بدات والله أعلم**

---

[1] - متفق علیه

## فەرموودەی حەفتا و دووەم

قال رَسُولُ اللّٰه ﷺ:

﴿سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ:

وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ﴾.[١]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

حەوت کۆمەڵە هەن خوا لەڕۆژی قیامەتدا ئەیانخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە...

کەسێك بەتەنیا یادی خوا بکات و، چاوەکانی فرمێسك ببارێنێ.

- بەڕاستی لەم زەمەنەی فیتنەیەدا زۆرپێویستە بۆ تاکی موسوڵمان کاتێکی تایبەت دانێ بۆیادی خودا و بەخۆداچونەوە.

[١] - متفق علیه

## فەرموودەی حەفتا و سێیەم

قال رَسُولُ اللّٰه ﷺ:

﴿سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ:

وَرَجُلٌ طَلَبَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ فَقَالَ: إِنِّي أَخَافُ اللهَ﴾.[١]

---

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

حەوت کۆمەڵە هەن خوا لەڕۆژی قیامەتدا ئەیانخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە لەناویاندا: پیاوێك ژنێکی خاوەن پلەو جوان داوای خراپەکاری لێبکات، بڵێت: من لەخوا ئەترسم.

[١] – متفق عليه

## فەرموودەی حەفتا و چوارەم

**قال رَسُولُ الله ﷺ:**

**﴿سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ:**

**وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ أَخْفَى حَتَّى لَا تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا تُنْفِقُ يَمِينُهُ﴾[١]**

**پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:**

**حەوت کۆمەڵە هەن خوا لەڕۆژی قیامەتدا ئەیانخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە لەناویاندا: کەسێك خێرێك بکات هێندە بیشارێتەوە تاوەکو دەستی چەپی نەزانێ دەستی ڕاستی چیکردوە.**

[١] - متفق عليه

## فەرموودەی حەفتا و پێنجەم

قال رَسُولُ الله ﷺ:

﴿سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ:

وَرَجُلَانِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ، اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ﴾،[١]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ:

حەوت کۆمەڵە هەن خوا لەڕۆژی قیامەتدا ئەیانخاتە ژێر سێبەری

عەرشی خۆیەوە (لەناویاندا): دووکەس تەنیا لەبەرخوا یەکتریان

خۆشەوێ و هەرلەسەرئەو

خۆشەویستیەش کۆئەبنەوە و جیا ئەبنەوە.

---

[١] – متفق عليه

# پێرست

## ❁❁ دیاری لە پاداشتی ئیلاهی ❁❁

